# عەشق نائومێدییەکی خۆشە

شیعر

گۆران رەئوف

سلێمانی ٢٠١٣


» عەشق نائومێدییەکی خۆشە

» نووسەر: گۆران رەئوف

» بابەت: شیعر

» تایپ و هەڵەچن: رۆزیتا

» بەرگ: جەمال جەلال

» چاپ: یەکەم، ٢٠١٣

» چاپخانە: یاد، بازاڕی سۆز، نهۆمی سێ

» تیراژ: پێنج سەد دانە

» نرخ (٢٠٠٠) دینار

» ژمارەی سپاردن (١٩٨٠) ی کتێبخانە گشتییەکانی دراوەتێ.

## پیاوێک هێشتا هەر چاوەڕوانە!

من کابرایەکم،
وەک ئەستێرە دورەکان، پەراوێز!
وەک باڵندەیەکی دوباڵشکاو،
بەجێماو!
ڕۆحلەبەرێکم، خۆری تەنهایم
هەرگیز ئاوانابێ!
من یەک پارچە تارمایی
ڕوناکییە شەرمنەکانم!
گڕکانێکم
بۆنی ئەو زەمەنانەم لێدێ
کەهیچ عەڕڕافێک پێشبینیان ناکات!



من پیاوێکم
خاڵی لە حیکایەتە دوبارەکان!
عەشقێکی شێتانەم هەیە
بۆ وشەی (نەخێر)!
خۆم و کتێبەکانم
دۆستی زۆر نزیکی هەڵهاتنین!
شوێنێکم نییە بەناوی ماڵ!
من منداڵێکی بێدایک و
سەرنشینی سەفەرێکی بێکۆتام!

من ڕوداوێکم بێقەدەر!
خەیاڵەکانم..
نامۆن بەتەواوی گەردون!
دەستەواژەکانم..
وەک خۆم بەدبەختن و
هیچ کەس خۆشی نایەلێیان!
هەندێ ئاوازم هەیە
دەترسم وێنایان کەم و
تەنانەت خوداشم لێ زیزبێ!



وەسوەسەیەکی
وەڕسکەر لەناخمدا
گینگلێ دەدا، تا پلەی توانەوەم!
تۆفانێکی وەستاوم
بەڕەنگی داڕمان و
چارەنوسێکی بێ چیرۆکم!
زۆرکاتیش بەجۆرێک وندەبم لەخۆم،
تەنانەت بیرکردنەوە لە خۆشم
نامدۆزێتەوە!

باوەڕدارێکم
بەردەوام دودڵ و دڵتەنگ،
بەگومانم لەو ڕێکەوتە سەیرەی ژیان!
هیچ کات دڵم بەوە خۆش نییە
کە ژیان بەردەوام بێت!
چونکە لەم چاوەڕوانییەدا
خەریکە دیقەکەم!



من پیاوە چاوەڕوانەکەی گەردونم!
ئەوەی هیچ شتێک شک نابەم
بۆ جیاوازیم لە ئینسانەکان..
تەنها چاوەڕوانیم نەبێ!
من ئەو کابرایەم دەتوانم
خۆم نەجاتدەم و ونبم!
بەڵام خەمی ئەو هاوشێوانەمە
کەلە سەدەکانی دواتردا
چاوەڕوانی دەیانکوژێ!

## چرکەکانی بەر لە مردن!

١

ئەمڕۆ پیاوە بستەبالاکەم بینی!



٢

بەهێواشی بەسەر پلیکانەکاندا
دەڕۆی.

٣

لەگیرفانی پاڵتۆکەیدا

نامەیەک کەوتەخوارەوە!



٤

نامەیەک پرشنگی درۆکانی

مەستیکردم!

بۆنی وشەکانی

ئەوەندەی گەمژەیی

بە ناچار هاوڕێکەم

بۆگەنبوو!

٥

دەنگی هەناسەی ئەو نامەیە
لەهەوا تورەکانی
بەفر سادەتربوو!



٦

"ئەم عەسرە لە باخچەکەی
نزیکماڵتان خۆمەکوژم!!"
نامەکەی ئەمەی تێدا نوسرابوو.

# عەشق نائومێدییەکی خۆشە

١
کەمنداڵبووم کچێکم خۆشدەویست،
ئەوکات ئەو لە پۆلی پێنج بوو،
من لە پۆلی شەش،
ئێستا ئەو پزیشکە و
منیش وشەتاش

ئێستا ئەو لە نەخۆشخانەیەکی گەورەدا
کاردەکات و
منیش لەژوورە تەنهاکەمدا،
نائومێدییەکانم دەژمێرم.



٢
باوکم توورەیە..
سیگار دەکێشێ،
دەیەوێت کفرێکیش بکات،
دەیەوێت بەتەواوی دین وەلانێ و
لەم کۆتاییی تەمەنەیەوە
کچە قەرەجێک بخوازێ.

دایکم وەڕسبووە لە داواکانی باوکم،
دەیەوێت بەدیار دراماکانەوە بمرێ،

٣

هاوڕێ شاعیرەکەم دڵتەنگە!!
خەم بۆ کچێک دەخوات...
بەڵام کچەکە ئەوەندەی
سوراوەکەی ئەمی بیرنییە!!



٤

شەوێک بەتەنها لەدەرەوەم،
بەفر دەبارێت...
سەرمایەکی ئێجگار سەختە
قوتوویەک بیرەم پێیە...
ڕێژەی کهولەکەی لەسەدا پێنجە!

حەسحەسی بازاڕ و
دوکانەکان گومانیان لێمە...
شێتێک حەزەکات میوانمبێت...
دەیەوێت پێکەوە
لە بەر بارینی بەفردا،
باسی تەنهایی بۆیەکترکەین.

من دەمویست بفڕم!
دەمویست بێمە بەردەرگای ماڵتان و
بمبینی...
چ عەوداڵێکم!
چ بێدینێکی ڕەنجبەبام!

حەزمەکرد بەو درەنگی شەوە
یەکێک لە هاوڕێکانتم دیبایە و
بەیانی باسی منتان کردایە!



بەڵام
هیچ کام لەمانە ڕوونادەن...

ڕۆژدەبێتەوە و بەیانی
دوکاندارێک بە نوکە قۆندەرەکانی
بێدارم دەکاتەوە.
هێشتا هەر نائومێدیەکان کۆتاییان نەهاتووە و
هێشتا هەر تەنهایی پێدەکەنێ.

# چێژوەرگرتن لە تەنهایی!

ئەم وڕێنانە بۆ ڕونبێژییەکانی هاوڕێی ئەزیزم کاک(جەمال جەلال).

١

کاتژمێری ژورەکەم وەستاوە!

پەردەی پەنجەرەکە

شەرمێکی یەکجار قورس دایگرتووە!

کتێبخانەکەم... ماتە،

بێدەنگە... دۆشداماوە!



٢

تیڤییەکەم تۆز خواردویەتی و

بەکراویی وەک ڕابردو!

کاسێتێک ئیشپێدەکەم و

دەیخەمە سەر ئەو میوزیکەی

کە تۆ لەڕابردو

حەزت لێی بو!

٣

ئاوێنەکەم کەدەمبینێ دەگریەت!
جێگەی خەوەکەم وڕوکاسە!
دەرگای ژورەکەم هەر هێشتا داخراوە!
ئەزانی قژم درێژە،
چڵکنە، ئاڵۆسکاوە؟!



٤

دوو کورسییەکەی جاران،
هەنوکە یەکێکیان شکاوە!
دوو کوپەکە...
قاوەکەیان تیادا وشک بۆتەوە!
گەلە پێکەنینەکان
ئەوەندە چاوەڕێبوون،
ئێستا ترشاون!

٥

تیانوسی بیرەوەرییەکان
بەکراوەیی لەسەر ئەو لاپەڕەیە
کەبۆیەکمجار پێتوتم:
"نائومێدییەکانم بە درێژی پرچمەوە گرێداوە"!



٦

ئینجانەی گوڵەکان
هێشتاکە حاڵیان نازانم.
وابزانم هاوسێکەمان
باخچەکە ئاوەدات.

٧

پێموابێت دوێنی بوو

هەستام وێنەکەتم سەیرکرد.

ئا...ئا هەروابوو،

دوێنی ورچە پەڕۆینەکەتم

لەباوەشگرت.

دوێنی لەتاریکدا و

بەدزی شیعرەکانی (نیچە)وە

ماچێکی وێنەکەتم کرد!



٨

کەی دێیتەوەی ئەمیرم؟!

ئەم وێرانەیە کوشتمی!

پاییزی٢٠٠٦

# بۆهەڵچوونی شەوێکم!

١

ئەمڕۆ زنجیری قەمسەڵەکەم خراپبوو!

هەر ئەو ڕۆژە کچێک بووە ئاشنام!



٢

من لەتاو درۆکانی ئەو کچە

فریانەکەوتم غەمێک بۆ

زنجیری قەمسەڵەکەم بخۆم!

٣

ڕۆژانێکی دواتر..
ڕۆژێک
ناخودئاگایانە ڕۆیشتمە
لای پینەچییەکی پیر و
زنجیری قەمسەڵەکەم چاککردەوە!
شەوی هەمان ڕۆژ
ئیدی لەدرۆی کچەکە ڕزگارمبوو..



٤

چ ڕێکەوتێکی سەیرە ژیان!
چ درۆیەکی گەورەیە
مەستبوون لەباوەشی ژندا!
چ گەمژانەیە
کەسانێکمان خۆشبووێت
هێندەی زنجیری قەمسەڵەیەک
کاریگەربن!

# وێنا ئاڵۆزەکانی خاتون

١

کاتێک کە پێدەکەنم..
کاتێک کە دڵم خۆشە..
پێکەنینی چی و دڵخۆشی چی!؟
باشترە بڵێم ئەو کاتانەی
جرتم بە ژیان دێت
تەنانەت تۆشم لەبیرنییە!



٢

کاتێک غەمگینم..
کاتێک گەروم گیراوە و
خەریکم دەگریم..
باشترە بڵێم ئەو کاتانەی
تەماحێکم بە ژیانە
تۆ دەبیتە گەوهەر!

٣

بەهاران کاتێک گوڵ دەپشکوێ..
دەنگی باڵندە کۆچەرییەکان دێ..
نا...نا باشترە بڵێم
وەختێ کە من بێهۆشم
لە دەنگەدەنگی خەڵک
رقم لە تۆشە!



٤

پایزان کاتێک ئاسمان هەور داپۆشیوە
باو و بۆران وەک دڵم هاواریانە..
نابێت...نابێت باشترە بڵێم
زەمەنێک کە خەیاڵەکانم لەودیوی
ژیانەوەن
من تۆم بۆجیاناکرێتەوە لە درۆکانی ژیان!

٥

شەوانێک کە تۆم دەکردە بیانوی
تورەبونەکانم
ساتگەلێک شوێنێک نەبوو
لێم نەبوبێتە دۆزەخ..
کورە باشترە بڵێم
ئەوکاتانەی بەتەواوی شێت دەبوم
ئەو چرکانەی هەستمەکرد زۆر پەتەڕیم
بەزەیم بەتۆدا دەهاتەوە!



## چیرۆکەکانی بێهودەیی

١

تۆ هەمیشە توشی خەمم دەکەی!
من ئەوکاتانەی تۆ توشی خەمم دەکەی،
هیچ ناکەم..
نە (مەی) دەخۆمەوە،
نە (سیگار) دەکێشم،
نەهیچ!
بەتەنها (خەم) خۆی دەخۆم!

٢

تۆ چۆن ئاو دەخۆیتەوە،

ئاوەهاش درۆ دەکەی،

کەچی من خەریکە دەمبە

داڕێژەری لۆژیکێک بۆ درۆکانت!





٣

تۆ بەشێکی لەو بێدەنگییەی

کە ناوەوەی سەرڕێژە

لە گریان،

هەگبەیەکی..

پڕ ئازار،

بەڵام من هێشتا

هەر بێدەنگیم خۆشدەوێ!

٤

تۆ هەرگیز براوەی
ئەم جەنگە نیت!
هیچکات ناگەیتە ئەو ساتەی
من و تۆ هاوسەنگانە بجەنگین،
کەچی هێشتا هەر حەزملێیە شەڕبکەین!



٥

من و تۆ
وێنایەکی نابوتمان هەیە،
من لەداخی پوچی ژیان
تۆم بەخۆمەوە هێشتۆتەوە،
تۆش لەبەرئەوەی
زۆر شەیدای بە من و ژیان
بۆیە بەرگەی تەنزەکانم دەگری!

# بێباکترین

١

من لە جەنگەکاندا نەکوژرام،
لە تۆفان و زریانەکاندا تیانەچووم،
کاتێ تاعون بڵاوبوەوە..
من زیندوبوم و نەمردم.
کەچی مەستی چاوەکانت وادەمکوژێ!!



٢

من لێدانە شێتانەکانی بابم
برینداری دەکرم و
ئەم جەستە شەکەتەمی لەکارنەدەخست.
شەڕەکانم لەگەڵ هەتیوە چەقۆکێشەکانی
بەردەم کۆگا و گازینۆکان،
نەیتوانی ئەم دڵە ناسکەم هەڵکۆڵێت.
کەچی تۆ بەدەستەکانت دڵمت دەرهێنا!!

٣

من وڵاتە و وڵات بە قاچاغ و
پیادەڕەوی و
لەناکاو کەوتنە نێو ئاوە مەنگەکانەوە
نەیخنکاندم و شەهیدنەبووم.
کەچی تۆ لەم وێرانەیەدا
لەخاچتدام!



٤

من شەوانێک کە نیشتیمانم
دابەشی دوکرابوو
شەوانێک تاریکی گشت لایەکی
کوشتبوو
من لەترۆپکی خەڵوەتەکانی
تەنهایمدا بووم و
وەک بێباکترین بوونەوەر زیندووبوم.

٥

من گوللەی تفەنگەکانی جنێو
کەللەی نەپژاندم.
حیکایەتی وردەواڵەفرۆشە دڵشکاوەکان
نەیگریاندم
من ئەو ئاوازە ڕۆحلەرزێنەرانە هەناسەیان
توندنەکردم.



٦

دڵنیاشم تا ناکۆتایی خەیاڵەکانم
شکست ناخۆم
دەیبەمەوە و
ئەم یارییە منالآنە وەلادەنێم
بەلاّم زۆر دڵنیام...
ئەفسونی دو چاو دەمکوژێ!
دڵنیام...
غوربەتی ڕوخسارێک دەمخنکێنێ!
بێدەنگی بێباکییەک
قاچەکانم دەشکێنێ!

## خەیاڵە دۆزەخییەکان و پەیڤە بەهەشتییەکان!

### سەرەداوی دۆزەخیبون!

١
لەبەر وتەکانی پێغەمبەر نەبوایە
دایک و باوکمم سەردەبڕی!



٢
دڵم هێند گەرمایەتی
گیرمخواردوە،
ناسوتێت و
هێدی هێدی
عارەق دەکاتەوە.

٣

ئەم بەیانییە شەیتان
بە ئەسپایی... زۆر بەئەسپایی
پێمیوت:"ئەمڕۆش هیچ!
چاوەڕێی ئومێد نەکەی!"



٤

چەندین سەبەتە گریانم پێیە
ئەمڕۆ سەیارەی خۆڵەکەت نەهات
خاڵی کەمەوە!

٥

من وەک باڵندەیەکی بەرزەفڕم
تۆ لەهێزی ئاین و زانستەکان
لەسەرتری..
کەمن دەمەوێت بفڕم
تەنها تۆ
دەتوانی بمبەستییەوە بەم
میکانۆییەی ژیانەوە!



## سەرەداوی بەهەشتیبون

٦

من لە ژورەکەی خۆمدام..
میوزیکێکی هێمن و لەسەخۆ گوێلێدەگرم..
دەنگی دەگاتە شوێنی خەوەکەی باوکم،
باوکم دەزانێت من خەریکی وشەکاریم
لەبەرئەوەی باش بخەوێت
دەڵێت:

-کوڕم بەچییەوە خەریکی؟
+نوسین!
_بڵێ شیعر!
+وایدانێین!
-باوکی خۆم خەریکی چیت،
مامۆستا (قانع)یش وایکرد
تامرد ٥ دیناری نەبو!
+دەزانم!
-ئەی کەدەزانیت، وازبێنە و
برۆ دو دینار پەیداکە!
+ناکرێت باوکە... ناکرێت
من خاوەن ڕۆحێکی نائارامم!
-خاوەن ڕۆحێکی گواویت، گواوی!!
باشە ئەو جوزە جوزە کزکە با کەمێک بتۆپم!



٧
ژورەکەم فێنکە و هەستدەکەم
دەرەوە بێئەندازە گەرمە!
دەڵێی دڵم لەدەرەوەیە
ئەوەندە گەرمایەتی!
واهەستەکەم من و دڵم
هیچ شتێک نامانبەستێتەوە
بەیەکەوە!
دایکم وتی:

-کورم سەردڵت بۆ خوساوە؟!
+گەرمایەتی، گەرما!
-گەرما!
+ئم گەرما!
-دیارە توشی دڵسوتانەوە هاتوی؟!
+هههها..دایە دڵسوتانەوەی چی؟
خۆ من ترشیم نەخواردوە!
-ئاخر باوکیشت وەهابو



هەرکات توشی دڵسوتانەوە هاتایە
ئاوەپەتاتەی دەخواردەوە
بۆئەوەی گەدەی باش بێت!
+دایکە تکادەکەم وازبێنە
من خۆم دەزانم دەردم چیە!
دەزانم هەرگیز دڵم وەک (خۆم) ناتوانێت بەرگەی
گەرمای واقیع بگرێت،
ناتوانێت بەرگەی تیشکی ئەو کیژانە بگرێت
کە خۆم حەزناکەم بمناسن!

٨

من پێویستە نوێژبکەم

تا شەیتان نزیکم نەبێت!

تا هیواکانی ژیانم بۆ دروست بنەوە!

ئەمە فەرمانی کچە هاوڕێکەم بو!





٩

ماوەیەکە هەرچەندە دەیبینم

ناتوانم بگریەم!

دڵم بێزاربووە لە گەرمادا،

کەچی گریانەکانم بونەتە سەهۆڵ و

سەبەتە سەبەتە کۆیان دەکەمەوە و

تیشکی گەرمی چاوەکانت هێند لاوازبون

ناتوانن بیانتوێنەوە و

رزگارم کەن لەم سەهۆڵبەندانەی گریان!

١٠

وای لەو ڕۆژەی کەش و هەوا تێک دەچێت و
دەتوێنەوە!
وای لەو لافاو و تۆفانەی
دەبێت چلۆن لەناوم بات!



١١

هێزی فڕین و یاخیبون لەمندا
هیچ شتێک یەکسانی نییە!
نە دین، نە زانست و
نە فەلسەفەی وڕێنەچییەکان!
بەلاّم
ئەوەی گەورەترە لە یاخیبونەکانم
ئەوەی بەرزترە لە فڕینەکانم
تەنها تارمایی مندالاّنەت و
دەنگی خەندە سەرکەشەکانتە!

## بەلەمی خنکاو

١

لەبیرمە ماوەیەک لەمەوبەر
هاوڕێ کچەکەم لێمی پرسی:
بۆ ئەوەندە نیگەرا ن و
نائارامی؟!





٢

من دوای کەمێک بێدەنگبون و
سەرسامبون،
... وتم:
بڕوابکە گەواد نییە
بزانێت بۆ وەهام!!

٣

ئێستا دێڕێکی (کافکا)م

بەرچاوکەوت،

کەدەڵێت:

"تەنها خودا بەخۆی دەزانێت

کە لە چی سەرچاوەیەکەوە

هەستی نیگەرانیم هەڵدەقوڵێت"!!



٤

ئایا من و کافکا

یەک گرفتاریمان نییە، هاوڕێم؟

## ٢١ ساڵ و شەش حەوت مانگ

هەنوکە بیست و یەک ساڵ و
شەش حەوت مانگم!
نازانم چەندیم بە خەو بەرێکردوە!
گرفتێکم نییە لەماوەی ئەم
تەمەنەدا چیمخواردوە و
چیم خواردۆتەوە!
بەڵام دڵنیام
چرکەیەکم نەبوە تێیدا وەرس نەبوبم!
ساتێکم نەبوە وەک چۆن لە ڕۆژە گەرمەکان هەڵدێین
وەها لێی هەڵنەهاتبم!
نازانم هەڵهاتنم بۆچی بو؟
بۆکوێ بو؟



لەشتێکی تریش دڵنیام..
من بەردەوام چاوەڕێ بوم!
چاوەڕێبوم
دۆخەکە باش بێت!
چاوەڕێبوم وەک پێغەمبەرەکان
موعجیزەیەک ڕومتێکات!
چاوەڕێبوم
ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی
بەمەستی دەگەڕام
لەپڕ ماشینێکی بارهەڵگر لێمبدات و
ئەو کەللەسەرەم بۆ چۆڵکات لەو وەڕسیانە!

من لەماوەی ئەم بیست و یەک ساڵ و
شەش حەوت مانگەدا
لە شتێکی تریش دڵنیام
دڵنیام ئەو چاوەڕوانبونەم
خۆفریودانێکی شاعیرانەیە!
ئەو موعجیزەیەش
هەرگیز ڕو لەمن ناکات!
لەم سەدەی بێ حیکایەتییەدا.



راستی من پێمشەرمە کەبڵێم
دڵنیام لەوەی
من پیاوێکی فرە ترسنۆکم!
گەر دە بیست و یەک ساڵی تریش بژیەم
هەرگیز ناتوانم خۆمبکوژم!
هەرگیز ناتوانم واز لە نائومێدکردنی
خەڵکانی دیکە بهێنم!

# جیهانەکانی ناوەوەم ئازارمەدەن!

١

ئەمرۆ براکەم وتی:
گەمژانەیە بێزاربیت و
هۆکارەکەی نەزانی!
گێلانەیە وەرس بیت و
نەزانیت بۆ وەرسی!



٢

وتی: برام بۆ غەمگینی؟
مەگەرتەنیا دو جیهان نییە؟
گەر ئەم دونیات دەوێ
برۆ چێژوەربگرە!
گەر بۆ حۆرییەکان و
ڕوباری شیر و شەراب
تێدەفکری؟
برۆ خەڵوەت!
برۆ میحرابی عیبادەت!

٣

من بێدەنگ بوم!
دواتر وتم هیچ کامیانم ناوێت!
ئەو سەرسام بوو!
من لەبەر سەرسامی ئەو
لەناکاودا وتم:
با..با...
ئەو دونیام دەوێت!
دەمەوێت!



٤

برام گوتی:
ئیٚ کەواتە غەمگین مەبە برام!
ژیان هەرچۆن بێت دەڕوا!

٥

من دیسانەوە بێدەنگ بوم!

دیسانەوە کەوتمەوە گومان لەخۆم!



٦

دواتر وتم:

ڕاستییەکەی من جودا لەم دو دونیایە

جیهان و دونیای دیکەم هەیە!

٧

برام پێدەکەنی..
وەک ئەوەی نوکتەیەکی
سەیری بیستبێ!



٨

من توڕەبوم و وتم:
بەڵێ من جیهان و دونیاگەلێکی
دیکە شک دەبەم و ئاشنام پێیان!
ئەوان لەناخم و لە ڕۆحمدان!

## سەیرترین جانەوەر!

١

کوڕە چەقۆکێشەکە مرد!!

تۆ پێکەنیت!





٢

کوڕە بانگوێژەکە شەهیدکرا!!

تۆ پێکەنیت!

٣

کوڕە قارەمانەکە لەخاچدرا!

تۆ دیسانەوە پێکەنیت!



٤

کوڕە حەماڵەکە لە ئاودا خنکا!

تۆ ئەمجارەش پێکەنیت!

٥

کوڕە چلورەفرۆشەکە لەقەراغ شار
درایە بەرگوللە!
تۆ وەک قەحبەکان پێکەنیت!



٦

کوڕە فیتەرەکە کارەبا کوشتی!
تۆ وەک جەللادەکان پێکەنیت!

٧

کوڕە ئەندازیارەکە لە بینایەکی بەرزەوە
کەوتەخوارەوە و مێشکی پڕژا!
تۆ وەک ئەوەی لە سینەما بیت و
بەدیار فیلمێکی کۆمیدییەوەبیت
هەر پێکەنیت!



٨

ئاخر پێمبڵێ
تۆ جگە لە پێکەنین شتێکی دیکە نازانیت؟!

## من ئادەم نیم...تا درۆکانی حەوا مەستمکا!

١

من پێویستم پێتە...

ئاخر پێکەکانی ژیان هێند تاڵە

دەبێت تۆ وەک مەزە بخۆم!



٢

چرکەیەک بەرلەوەی

ڕازیبم بە درۆ جوانەکانت

خۆم مەستی

خەونێکی ژیان دەکەم!

٣

کاتێک تۆ لەگەڵ پاسارییەکان
خەونەکانت لەگەڵ خەیاڵەکانمدا دەتوێنییەوە
من لە خەیاڵەکانیشم هەڵدێم!



٤

ئەو دەمەی لەگەڵ وردەواڵە فرۆشێک
پێدەکەنی و هێشتا هەر منت لەیادە
من لەخەیاڵی خۆمدا تابوتێکم بۆ سازکردوی!

٥

تۆ هەرگیز ناتوانی
وێنا شێواوەکانم هەستپێبکەی!
بۆیە منیش ناتوانم لە وڕێنەکانت بگەم!



٦

ڕۆژێک کە ڕوناکترە لە شەوە تاریکەکان..
تۆ دەگرییەت!
شەوێک کە تاریکترە لە ڕۆژە تاریکەکان..
تۆ هەر دەگرییەت!
سەیرکە..
تۆ هەرگیز ناتوانی
لەو خەونەبچوکانەت دەرچی!

## ئینسان یەکسانە بە ستایش

١

ئێمە بۆیەک گرفتارین!
ئێمە لەدوورەوە هەست بەجوانی یەکتر دەکەین!
ئێمەی ئیمپراتۆری خەونە دۆزەخییەکان!
پڕین لە شەرمەزاری بۆ درۆ!



٢

چ ئاڵۆزییەک دەبینم!
چ تەقینەوەیەک هەستپێدەکەم!
من لەسەر و ڕۆحی ئەو ئازارانەوە دەژییەم
کەمەودایەکیان نیە بۆ ژیان!

٣

من لەئەدرەسی خۆم گومانم هەیە!
بۆیە تائێستا بڕوا بەوەناهێنم
کەئەم زەوییە شوێنی منە!
ناتوانم خۆم فریودەم و
وەک درۆی ئینسانە هەلویستەکان
بلێم: سەر زەوی خۆشە...
بلێم: عەشق گەمەیەکی کۆنی ڕۆحە!





٤

من پێویست بوو ڕاهیبی
پەرستگایەک بوومایە لە سین.
دەبوو جانتام
لەو کاروانسارایانە گرتایە
کە بەقوڵی هەزاران میل
گەڕابوونەوە ناخی خۆیان!

٥

کەڵکی من لەسەر ئەم زەوییەدا چییە..

جگە لە دوپاتکردنەوەی کۆمەڵێک دەستەواژەی سوواو!

کەڵکی من چییە...

جگە لە نائومێدکردنی خەڵکانی تر!

جگە لە پلانەکانم دژی ژیان!

کەڵکی من بۆئەم هەسارەیە چییە..

جگە لە هەستکردن بەپەراوێزییەکی ئەبەددی!



٦

ئەی خنجیلانەتر لە تەنهایی شەوێکم،

لەم پوچی ژیانەدا

هەست بە نەسیمی لەرەی

دەنگت دەکەم!

نازانم بۆناتوانم

وەک ئەم درۆگەورەیەی

کەناویان ناوە ژیان

حیسابت بۆبکەم!

# داليا و حيكايەتەكانى نامۆبون!

زەمەنێک بو
پەڕی گوڵەکان بۆمن
ژیانی ئەودیو وەهمەکانم بو!
گۆڕانکاری وەرزەکان
بۆمن سەفەرە دورەکان بوو!
تەمەنێک لەخەونی فڕیندا
ببوومە پادشای ئومێد
ببوومە پیاوێک
پڕ لەحیکایەت!



ژیانێک
بەدەم گفتوگۆی خۆم و
پاڵەوانی خەیاڵەکانمەوە
ئەدرەسی هیچ جێگایەکم
نەدەزانی!
مەملەکەتێک نەبو ئەندێشەم
بۆخۆی ببات!
شارێک نەبوو شەیدای کیژەکانیم بکات!
بەلاّم ئێستا
واخەریکە تەقینەوەی خۆر
هەمو ژیانم دەسوتێنێ
کەچی تۆ لەگەلّ خەیاڵە ڕەشەکانتا دەمبەی!!

من هەزاران ڕێگام هەبوو
بۆ دەربازبون لە درۆی ئینسانە ڕاستگۆکان!
من خاوەنی بێباکییەک بوم
زەویم وەک مورویەک دەبینی
بەدەستەکانمەوە!
گەر بمویستبا بە هەسارەکان
هەڵماتێنم دەکرد!
بە ئەستێرەکان
وەک منداڵە چەقاوەسووەکانی
گەڕەک شەڕەبەردم دەکرد!
گەر بمویستبا





تەواوی هەورەکانم دەخواردەوە!
تەمەکانم لەخۆم دەئالاند،
بەلاَم نەمتوانی ئەو پریاسکە
توڕەییەم ونبکەم
کە سێبەری بارانی ئەوینت بو!
نەدەکرا ئەو بەردبونەی دڵمت
نیشان نەدەم
کە هاوڕێ بو، لەگەڵ بەهای خەیاڵتدا!

جاران لە ژورەکەی خۆمدا نەبێت
لەنێو کتێبە بێدەنگەکانمدا نەبێت
لەتەنیشت دەستنوسە
شپرزە و تورەکانمەوە نەبێت
لەدەریا قوڵەکانی
خەیاڵە نامۆکانمەوە نەبێت
لەهەرکوێی ئەم دونیایەدا بوبم
غەریب بوم!
تەنهابوم!
ئێستا بە ژورەکەشم نامۆم!
بە کتێب و دەستنوسەکان و
خەیاڵە قوڵەکانیشم غەریبم!
بەڵام ئەوەی بۆتە نیشتیمانم..
ئەوەی بۆتە جلەوی یاخیبونەکانم..
درۆ جوانەکانی تۆیە!!



ئیستا بەخۆم دەڵێم
لەبیرتچو.. برادەر.. لەبیرتچو
تۆ خاوەن تابلۆی حیکایەتەکان بوی؟
لەبیرتچو ئەی ڕۆحە یاخییەکەی
گشت چیرۆکەکان لەبیرتچو
تۆبوی هیوای شکستە براوەکان؟
تۆبوی تا دواچرکەکانی
ئەم روداوە لەناکاوانە
گۆرانیت بۆ موعتادەکانی
قەراغی شار دەخوێند؟!
ئێستا بەو هەمو زڵوماتە سپیانەتەوە
دەتەوێت کام لای خەونەکانی وەک خۆت ڕەش کەی؟
دەتەوێت بەو سێبەرە شەکەتەوە
تەلاری خەونەکانی ڕاستکەیتەوە؟

ئەی سۆزانییە دڵپاکەکە،
ئەی ئەو سۆزانییەی
هێندەی تەواوی سۆزانییەکانی دونیا
پەیڤای،
پەیڤایت و نەتتوانی
بەشێک لەو باخچە تاریکەی خۆتم بەشدەی!
پەیڤایت و نەدەکرا
سەبەتەیەک لە فرمێسکەکانتم ئاشناکەی!



تۆ ئەی ترسناکترین جادوی سۆزانییبون،
ئەی خاتوونە زڕڕەکەی ئافرەتبون،
من هێشتا وەک ئەو پیرەپیاوەی
توانای ماچکردنی نەماوە
خەیاڵێکی نامۆ بەخۆم،
پیمدەڵێ غەریبی ئەو کچە دەکەم!
ئەو سۆزانییەی خەریکبو
یاساکانم یاساغکاتەوە!
ئەو فریشتە ئەهریمەنزادەیەی
لێگەڕابام خەیاڵەکانمی دەخواردەوە!
بێدەنگ بومایە،
خەونەکانمی دەدا بەدەمم باوە!

## تەنهایی نا، هەستکردن بەتەنهایی دەمکوژی[٧]!

من باوەڕموایە زۆر ئاساییە تەنهایی، دەکرێت لە زەمەنێک لە زەمەنەکاندا ئینسان بەر خودی تەنهایی بکەوێت، دەکرێت ژیانێک لەنێو تەنهایدا بژی، بەڵام ئەوەی موسیبەتەکەیە هەستکردنە بەتەنهایی! ئەوەی وادەکات تۆ گەر تەنهاش نەبیت و لەنێو جەنجاڵییەکی تەواودابیت.. یان باشترە بڵێین لەنێو ژیانێکدا بیت دور لە مەفهوم و فۆڕمی تەنهایی، بەڵام هێشتا هەر هەستبکەیت تەنهای! هێشتا هەستی تەنهاییت لە قوون نەبێتەوە!! بەباوەڕی من ئەوە گەورەترین و قورسترین سەرەتانە!!



١

کات نیوەی شەوە،
بەتەنهام، تەنهای تەنها!!
پارچە میوزیکێکی هیومانڕاید تەنهاترم دەکات.
دایکم بەئاگایە و دەیەوێت بزانێت
کوڕەکەی بەم کاتە درەنگەچی دەکات؟

٢

گریان گەرویی گرتووم،

بیر لەهیچ ناکەمەوە،

تەنهایی بۆتە... نا..نا تەنهای نا

هەستکردن بەتەنهایی بۆتە نان و ئاوم.



٣

هەندێجار دەمەوێت بڕۆم و

شارەکانی تر ئەزموون بکەم

وادەکەم..

بەڵام تەنهایی... نا..نا

هەستکردن بەتەنهایی

وەک گەنە پێوەم نووساوە!

٤

دایکە خەتای چییە من ئاوام؟؟

-کوڕم چۆنی؟

+دایکە نامۆم،

بێزارم،

دایکە تەنهام.



٥

ئیدی دایکە دەگریت و

بەردەبێتە کتێبەکانم

لەپێشدا کتێبخانەکەم تێکوپێک دەدا

یەکە یەکە کتێبەکان دەدڕێنێ و

هەنجن هەنجنیان دەکا.

٦

من دەگریەم،
بۆ خۆم نا،
بۆ کتێبەکانیش نا،
بۆ هەستکردن بەتەنهایش نا،
دەگریەم بۆ ئەوەی هێشتا مندالّم.





٧

ئیدی دایکم چاوەکانی دەسڕیٚ و
دەلّیٚت:
کورِم تۆ وانەبووی،
ئەم کتێبە نەعلەتیانە شێتیان کردووی،
دەلّیٚت:
من دلّنیام تۆ وانەبووی،
تۆ ڕۆژانێک هەستی پێغەمبەربوون
دلّخۆشی دەکردی،
بەلاّم ئێستاکە لەم ژووره خامۆشەوە
کتێبی شەیتانی کوشتویتی!

٨

دایکم کەمێک لەجێی خۆی دێتەپێشەوە و
دەستێک بۆ پشتی سەرم دێژدەکا و
بەسەربادانێکەوە دێتەوەگۆ و
دەڵێت:
بەڵێ تۆ کتێبی
ئەو پیاوە گەمژانە لەخشتەیان بردوی!

## ئاوازێک کە ناهێڵێ بنووم

نامەوێت بڵێم تەنیام
نامەوێت باسی غەریبی
خۆم بکەم

پێمخۆشنییە
هەمو سەری سەعاتێک
ئەم وشانە دوبارەکەمەوە





بەڵام
هەستەکەم ئیدی
نامەکانت...
بینینەکانت...
تەنانەت گفتوگۆ و
پەیڤە خەندەئامێزەکانت
ناتوانن تەنیایم لێ زەوتکەن!
هەرگیز دەرەقەتی
ئەو غەریببەم نایەن
لەگەڕانم بەدوای کۆتاییدا،
وندەبم، ون!

## کۆنتراس١

١

دەمەو ئێوارە..
من لە حەمامدام..
بە ئارامی سەرم لەکەف
دەئاڵێنم!



٢

کارەبا نییە،
حەمامەکە ڕوناکییەکی
کز دەیگرێتەوە.

٣

لەناکاودا
تۆ دەکەویتە خەیاڵم!
دەستەکانم لە سەرمدا و
لەنێو کەفێکی زۆردا نوقم بوە.



۴

هەستەکەم حەمامەکە ڕوناکەوەبو!
وا دیارە کارەبا هاتۆتەوە؟!
کەف لەخۆم دەکەمەوە..
تەماشادەکەم..
حەمامەکە وەک خۆیەتی!

٥

ڕاستییەکەی دیمەنەکە کۆمیدییە!
مایەی قاقایەکی ڕاستەقینەیە!



٦

ئاخر من هەرکات تۆ دێیتە خەیاڵم
یان کەبیر لەتۆ دەکەمەوە
هەموشتەکان ڕوناک دێنەپێشچاو
دونیا دەبێتە یەک پارچە ڕوناکی!

کۆنتراس: ڕەنگی دژبەیەک.

# باخچەکە پڕە لە هیچ

١

زەوی هیچی بۆمن نییە..
منیش هیچم بۆئەو نییە!
ئەوەی لەم نێوەندەدا دەگوزەرێ
جگە لە هیچ
هیچی تر نییە!



٢

ژنە سواڵکەرەکە
دەدات لە کورە دوانزە
ساڵانەکەی!
ئاخر بازنەی خەونەکانی
کوڕەکەی
لە داهاتەکەیان تێپەڕیوە!

٣

من خۆم،

(پیاوە تەنهاکەم)!

دەدەم لەخۆم!!

ئاخر بازنەی خەونەکانم

هیچیان تێدانییە!!!